ئەلقەی نۆیەم

زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان



# بانگەواز بۆلای خودا

## چی یەو چۆنەو بەکێ و بۆچی دەکرێ؟




بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: خەمبار مەبە
نوسەر: عائیزی قەرنی
وەرگێرانی: ئەحمەد عەبدوڵلا وەرتی
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم 1428ك – 2007ز
تیراژ: 3000 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (201)ی ساڵی 2007 ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com



﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (فصلت –33 )

# پێشکەش بێ

بەو کەسانەی کە بە زمانی هەڵوێستو کردار، پێش قسەو وتار خەڵکی بەرەو خوا بانگ دەکەنو، لە بانگەوازەکەشیان دا وردبینیو لێزانییو چاکترین شێواز ڕەچاو دەکەن.

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز:

ئەم نامیلکەیەش وەك هاوەڵەکانی دیکەی دەقی وتارێکە کە لە مانگی (1)ی ئەمسالْ (2007)ز دا ئاراستەی کۆمەڵێك لە مامۆستا وتاربێژو بانگەوازکارە بەڕێزەکانم کردوە لە شاری (هەولێر)، پاشان دوای هێنرانە سەر کاغەز(1)و چاوپێداگێڕانەوە، بەم جۆرەی لێ‌هاتوە.

ئاشکراشە کە بابەتی بانگەوازو خەڵك بەرەو لای خواو ئایینەکەی بانگ کردن، بابەتێکی یەکجار گرنگ‌و هەستیارەو ئەگەر بوێ ستری هەقی خۆی پێ‌بدرێ، پێویستە چەندان وتاری بۆ تەرخان بکرێن. بەلام پێم وایە بەندەش لەم وتارەدا بە کورتی‌و پوختی چەند لایەنێکی گرنگی ئەو بابەتەم خستوونە ڕوو کە پێویستە لەم واقیع‌و هەلومەرجەی ئێستای کوردستاندا ڕەچاو بکرێن لە لایەن مامۆستایانی وتاربێژی بەڕێزەوە، بە تایبەت‌و بانگخوازنەوە بە گشتی.

خواش (سبحانەو تعالی) بەرەکەت بخاتە کارو چالاکی‌یەکانمانەوەو لێمان قبوولْ بفەرموێ.

سبحانك اللهم وَبحمدك أشهد ألاّ اله إلاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك.

---

(1) لە لایەن کاك (حیدر مظفر)ەوە، دوایش کاك (مەلا بلال) سەر لە نوێ نووسیوەتەوەو ڕێکی خستوە ... خوا پاداشتیان بداتەوە.

هەولێر ، 13 ربيع الأول 1428 - 1ی نیسانی 2007

# دەستپێك

الحمدلله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم وَبارك على حبيبنا وَ شفيعنا محمد سيد الأنبياء والمرسلين وإمام المتقين وَقائد المجاهدين وآله أجمعين من الصحب والقرابة والأزواج والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

مامۆستایانی بەڕێزو خۆشەویست!

زۆر خۆشحاڵم کە بۆ جاری دووەم بە دیداری ئێوە شاد بوومەوە، ئەو بابەتەی ئامادەم کردوە پێشکەش ئێوەی بەڕێزی بکەم، ناوو نیشانەکەی بەم شێوەیەیە:

((بانگەواز بۆ لای خوا (سبحانەو تعالى) چىيەو چۆنو بە کێو بۆچی دەکرێ؟!)) .

واتە: خوا پشتیوان بێ لەم وتارەمدا باسی بانگەواز بۆ لای خوا (الدعوة الى الله) دەکەین، ئەویش لە چوار تەوەرەی سەرەکی دا:

یەکەم: بانگەواز بۆ لای خوا (سبحانەو تعالى) چی یەو چ پلەو پایەیەکی هەیەو چ گرنگییەکی هەیە؟!

دووەم: چۆنیەتی ئەنجامدرانی بانگەواز بۆ لای خوا، هەم لە ڕووی شێوازیو هەم لە ڕووی ڕێبازیو هەم لە ڕووی ئامرازییەوە.

سێیەم: بانگەواز بۆ لای خوا بەکێ دەکرێو کێ دەتوانێ خەڵك بۆ لای خوا - جل شأنە- بانگ بکاتو لێی نزیك بکاتەوە وە خەڵك لە شەریعەتو بەرنامەی خوا شارەزا بکاتو پێیان ئاشنا بکات؟!

چوارەم: ئامانجی بۆ لای خوا (سبحانەو تعالی) چی‌یە؟

## 1) بانگەواز بۆ لای خوا (سبحانەو تعالی) چی یەو چ پلەو پایەیەکی هەیەو چ گرنگییەکی هەیە؟!

بەرێـزان!

ئەگەر سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئانی بەرێز بدەین، زۆر بە ڕۆشنی تێدەگەین کە بانگەواز بۆ لای خوا چییە، وەك پێناسەکەی، بۆ نموونە: خوا بەرزو مەزن لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿**قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**﴾ (یوسف -108)، واتە: بلێ- ئەی محمد ﷺ ئەمە ڕێبازی منە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکەم لەبەر ڕۆشنایی‌دا خۆم‌و ئەوانەی کە شوێنم دەکەون وە پاکی بۆ خوا من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم.

کەواتە (بانگەواز بۆ لای خوا) واتە: بانگەواز بۆ لای ڕێبازی خوا، بۆ لای ئایینی خوا، بۆ لای بەرنامەی خوا (سبحانەو تعالی).

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿**وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَفْرَحُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ الأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُ قُلْ إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللّهَ وَلا أُشْرِكَ بِهِ إِلَيْهِ أَدْعُو وَإِلَيْهِ مَآبِ**﴾ (الرعد- 36)، واتە: ئەوانەی کتێبمان پێدابوون واتە پێش ئوممەتی ئیسلام کە مەبەست جوولەکەو نەصرانی‌یەکانە بە پلەی یەکەم- دڵخۆشن بەوەی بۆ تۆ نێردراوە تە خوار، بەڵام لە پێڕو تاقمەکانی کوفر کە سانێك هەن نکوولی لە

بەشێکی ئیسلام دەکەن- واتە: هەندێك شتیان کە لە گەڵ ئیسلامدا خاڵی هاوبەشە، نکوولیی لێ ناکەن، بەڵام ئەوەی کە لە گەڵ هەواو ئارەزووەکانیان دا دژ دەوەستێو تێك دەگیرێ نکوولیی لێ دەکەن، بۆ نموونە: مەسەلەی خوا بەیەکگرتنو بانگەواز بۆ لای خوا بە پەرستنیو هاوبەش بۆ دانەنرانی- جا تۆ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: من فەرمانم پێکراوە کە خوا بپەرستمو هاوبەشی بۆ دانەنێم، بانگەواز بۆ لای ئەو دەکەمو گەڕانەوەش تەنیا بۆ لای ویە.

کەواتە: بانگەواز بۆ لای خوا، واتە: بانگەواز بۆ بەندایەتی کردن بۆ خوا، کە خەڵك بانگ بکرێ بۆ ئەوەی بەندەی خوا بن، ﴿قُلْ إِنَّمَا أُمِرْتُ﴾ من تەنیا بەوە فەرمانم پێکراوە، (أَنْ أَعْبُدَ اللّهَ) کە تەنیا خوا بپەرستم (وَلا أُشْرِكَ بِهِ) وە هیچ شتێك نەکەمە هاوبەشی، (إِلَيْهِ أَدْعُو وَإِلَيْهِ مَآبِ)(الرعد-36) ئەو خوایە کە فەرمانم پێ کراوە تەنیا ئەو بپەرستمو هاوبەشی بۆ دانەنێم، من خەڵك بۆ لای ئەو بانگ دەکەم، کە هەر ئەو بپەرستنو هاوبەشی بۆ دانەنێنو بێگومان گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

هەروەها هەر لەوبارەوە خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ (النحل-125)، واتە: بانگ بکە بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و ئامۆژگاری باش، وە بە چاکترین شێواز وتووێژیان لەگەڵ بکە. بێگومان پەروەرگارت زاناترە بەوانەی لە ڕێی وی لایان داوەو، هەر ئەویش زاناترە

بە ڕێی ڕاست گرتووان.

ڕەنگە ئەمە یەکەمین شوێن بێ لە قورئان دا کە وشەی ( سبيل)ی زیاد کردوە، لە هەموو شوێنەکانی دیکەدا هەر دەفەرموێ: (ادْعُ إِلَى رَبِّكَ) یان (أدْعُوا إِلَى الله) بەڵام ئەو ئایە تەی سوورەتی (النحل)دا درێژە (تفصیل)ی ئەو (إجمال)انەیە، چونکە وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا بانگەواز بۆ لای خوا، واتە: بانگەوازو بانگ کردن بۆ لای ڕێبازی خوا، بۆ لای دین‌و شەریعەت‌و بەرنامەی خوا.

بۆیە (طبري) (ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ) ئاوا پێناسەی بانگەواز بۆ لای خوا دەکات: (هي دعوة الناس الى الإسلام بالقول والعمل)[1]، واتە: بانگەواز بۆ لای خوا بریتیە لە بانگ کردنی خەڵك بەرەو ئیسلام چ بە قسە بانگیان بکەی چ بە کردەوە.

واتە: بە کردەوە بۆیان ببیە سەرمەشق بە شێوەیەك کە خەڵکی دینداریی‌و مسوڵمانێتی لە تۆدا ببینن، کە لە ڕاستیدا زمانی کردار زۆر لە زمانی گوتار گۆیا (فصیح) ترەو خەڵك باشتر لێی حاڵی دەبێ‌و لێی تێدەگات، نەك هەر ئەوەندە بەڵکە هەرکەسێك هەرچەندە زمانی قسەو گوتاری چاك‌و جوان بێ، مادام زمانی کردار و حاڵی وێران و خراپ بێ، خەڵك قسەکانیشی لێ وەرناگرێ! وەك پێشینانی خۆمان دەڵێن: (ئەوەیە وەستای قسان‌و کۆڵەواری دەستان))!!

جا مادام مەبەست لە بانگەواز بۆ لای خوا، بانگەوازو بانگکردنی

---

(1) بڕوانە (تفسير الطبري) بەرگی /1، لاپەڕە (53).

خەڵك بێ بۆ لای دینو ڕێبازو شەریعەتی خوا، کەواتە بە بۆچوونی من بانگەواز بۆ لای خوا سێ پلەی هەیە:

پلەی یەکەم: ئەوەیە کە خەڵك لە کوفرو شیرکو نیفاقەوە بانگ بکرێ بۆ ئیمانو خوا بەیەکگرتن.

پلەی دووەم: ئەوەیە خەڵك لە سەرپێچیو لادانەوە بانگ بکرێ بۆ فەرمانبەریی و پابەندیی بە دیندارییو خواپەرستی یەوە.

پلەی سێیەم: بریتییە لەوە کە خەڵك لە ساردو سڕییو کەمتەرخەمی بەرانبەر بە شەریعەتو دینی خواوە، ئاگادار بکرێتەوەو بانگ بکرێ بۆ هەستکردن بە بەرپرسیارێتیو مشوورخۆریی.

ئەوە لەبارەی پێناسەو نێوەڕۆکی بانگەواز بۆ لای خواوە، کە بریتییە لە بانگکردنی خەڵك بۆ پابەندیی بە شەریعەتی خواوە (سبحانەو تعالى) جا ئەگەر بێبڕواو کافربن بانگیان دەکەین بۆ بڕواهێنانو، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دانەربن بانگیان دەکەین بۆ خوا بەیەکگرتن، وە ئەگەر مسوڵمانی گوناهبار بن، بانگیان دەکەین بۆ گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی بۆ خواو، بانگیان دەکەینو لە سەرپێچیو لادانو تاوانکارییەوە دەیانگوازینەوە بۆ فەرمانبەرییو چاکەکارییو پارێزکاریی، بەڵام ئەگەر ئیمانو پابەندییان هەبێ لە خودی خۆیاندا، بەڵام کەمتەرخەمییان هەبێ بەرامبەر بە ئیسلامو مسوڵمانان، ئەوە بانگیان دەکەین بۆ هەستکردن بە بەرپرسیارێتیو تێیاندەگەیەنین کە مسوڵمانێتی هەر ئەوەنییە کە لە زاتی خۆتدا ئەنجامی بدەی، بەڵکو دەبێ لە دەوروبەری خۆشتندا ڕەنگ بداتەوە، وەك خوای پەنهان بین لە سوورەتی (العصر)دا چوار مەرجی داناون بۆ

هەڵاواردنی ئینسان لە زیانباریی دونیاو دوارۆژ، وەك فەرموویەتی:
بسم الله الرّحمن الرّحیم ﴿وَالْعَصْرِ ۞ إِنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۞ إِلا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾،
واتە: سوێند بە ڕۆژگار (یان نو ێژی عە سر) بێگو مان مرۆ ڤـ لە زیانباریی دایە. جگە لەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن. وە یەکدی ڕادەسپێرن بە هەق (ئیمان هێنان بە هەق‌و پ ێوە پابەندبوونی) وە یەکدی ڕادەسپێرن بە خۆڕاگریی(لەسەر هەق)، کەواتە:
خوای کاربەجێ (عزّو جلّ) چوار شتی بە مەرج گر توون بۆ پاریزرانی ئینسان لە دۆڕان‌و زیانباریی:

1و2 بڕواو کردەوەی چاك، بڕوا ئەوەیە ئەو ڕاستی‌یەی لە خواوە بە پێغەمبەردا ﷺ نێردراوە ئینسان قبوولّی بکات‌و بە ڕاستی بزانێ‌و خۆشی بوێ‌و بۆی ملکەچ بێ بە دەرو دەروونەوە، وە کردەوەی چاك کە بەرهەمی ئەو قەناعەت‌و ئیمان‌و عەقیدەیە، ئەوەیە کە ئینسان لە زاتی خۆیدا بە ئیسلامەوە پابەند بێ، بەڵام ئیمان‌وکردەوەی باش تەنیا دوو مەرجن‌و بەوەندە ئینسان بەس دەبێتە نیوە مسوڵمان! بۆیە دەبێ ئەگەر مرۆڤەکان بیانەوێ مسوڵمانی باش و سەرفراز بن، جگە لە ئیمان‌و کردەوەی چاك دوو مەرجی دیکەشیان تێدا بێنە دی.
3 و 4 ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ ئەو هەقەی وەرت گر تووەو پێێت ڕاستەو هەزمت کردووەو کاریشت پێکردوە، دەبێ بیگە یەنی بە خەڵك‌و پاشان خۆڕاگریش بێ لەسەری‌و خەڵکیش ڕاسپێری بە

خۆڕاگریی لەسەر ئەو هەقە، چونکە بەبێ خۆڕاگریی‌و دامەزراویی‌و ڕاوەستاویی، ناگونجێ ئینسان لەسەر هەق بەردەوام بێ.

## پلەو پایەی بانگەواز بۆ لای خوا

ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتانەی کتێبی خواو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ بکەین زۆر جوان دەردەکەوێ کە بانگەواز چ پلەو پایەو چ گرنگی‌و بایەخێکی هەیە:

* خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (فصلت -33)

وەك پرسیارکردنی ئینکاریی (الإستفهام الإنكاري) دەفەرموێ: کێ قسەی چاکترە لە هی کەسێك کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات، وە کردەوەی چاك دەکات‌و دەڵێ من لە مسوڵمانانم؟!

مادام قسەی هیچ کەسێك لە قسەی ئەو کەسە باشترە نەبێ، دیارە هیچ کەس لەو باشتر نیە! چونکە قسەی زۆر باش ئینسانی زۆر باش دەیکات‌و کردەوەی زۆرباش ئینسانی زۆرباش دەیکات! وەك گوتراوە: (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ)، کەواتە: خەڵك بانگ کردن بۆ لای خوا چاکترین قسەو چاکترین کردەوەیە، بێگومانیش کەسێك وەك پێویست بەو کارە هەڵدەستێ کە لە هەموو کەس چاکتر بێ، ئەوانیش پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)و میراتگرە ڕەسەنەکانیانن.

* هەروەها خوای باڵادەست پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دەدوێنێ‌و

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ۞ وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا﴾(الأحزاب 45-46)، واتە:(ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە تۆمان ناردوە چاودێر بی، ترسێنەر بی، دڵخۆشکەر بی، وە بانگەوازکار بی بۆ لای خوا بە فەرمانی خوا وە چرایەکی تیشکدەر بی).

لێرەدا خوا (سبحانەو تعالى) بە سێ شت پێغەمبەر ﷺ وەسف دەکات: بە (شاهد) چاودێر بەسەر خەڵك‌و ئۆممەتی‌یەوە، وە بە (نذير) ترسێنەرو ورياکەرەوەيان، وە (مبشِّر) دڵخۆشکەريان، واتە: ترسێنەری ئەوانەيە کە سەرپێچی دەکەن‌و دڵخۆشکەری ئەوانەيە کە فەرمانبەريی دەکەن، هەروەها پێغەمبەر ﷺ بەوە وەسف دەکات کە: (وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا) چرايەکی تيشکدەرە، چونکە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات، دەيانترسێنێ لەوەی کە سەرپێچی بکەن، وە دڵخۆشيان دەکات ئەگەر فەرمانبەريی خوا بکەن، دیارە ئەوەش پلەو پایەیەکی زۆر گەورەيەو وەك چۆن چرا بەرچاوی خەڵك ڕۆشن دەکاتەوەو بەرەو ئامانج ڕێنمايی‌يان دەکات‌و، لە کەوتن‌و لادان‌و سەرگەردانيی دەيان پارێزێ، ئەويش بە هەمان شێوە.

* هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((مَن دعا الى هدىً كان له الأجر مثل أجور من تبعه لا ينقص ذلك من أجورهم شيئاً، ومن دعا الى ضلالة كان عليه من الإثم مثل إثم مَن تبعه لا ينقص ذلك عن إثمهم شيئاً))(1)، واتە: هەر کەسێك خەڵك بانگ بکات بەرەو

(1) بڕوانە: (صحيح مسلم) کە لە (أبو هريرە)وە هێناويەتی بە ژمارە (2674).

خێرو چاکەو هیدایەت‌و ڕێنمایی خواو بەرەو بەرنامەو ڕێبازی خوا، بە ئەندازەی پاداشتی هەموو ئەوانەی کە دەکەونە ژێر کاریگەریی قسەکانی‌و شوێنی دەکەون پاداشتی هەیە، بێ‌ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە  واتە لە هی هەموویاندا بەشدارە- بە پێچەوانەشەوە، هەرکەسێك خەڵك بانگ بکات بەرەو گومڕایی‌و سەرلێ شێواویی، گوناهی بە ئەندازەی گوناهی هەموو ئەوانەیە کە لە گومڕایی‌دا شوێنی دەکەون، بێ‌ئەوەی لە گوناهی ئەوانیش کەم بێتەوە...

* هەروەها لە بەسەرهاتی جەنگی خەیبەردا پێغەمبەر ﷺ ڕوو بە (علي) کوڕی (أبو طالب) خوا لێی ڕازی بێ، دەفەرموێ: (فو الله لأن يهديَ الله بَكَ رجلاً واحداً خيرٌ لك مِن أن يكونَ لَك حُمرُ النَّعَمِ)[1]،واتە: (سوێند بە خوا ئەگەر خوا بە هۆی تۆوە پیاوێك -کەسێك- هیدایەت بدات‌و ڕێنمایی بکات، بۆ تۆ چاکترە لەوەی حوشتری سپیت[2] هەبن) دیارە حوشتری سپی لەو ڕۆژگارەدا سامانێکی زۆر بەنرخی عەرەب بووە.

* هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەوبارەوە دەفەرمووێ: (مَن دلَّ على خيرٍ فلهُ مثل أجر فاعله)[3]، واتە: هەرکەسێك ببێتە هۆی چاکەیەك بە ئەندازەی ئەنجامدەری ئەو چاکەیە ئەویش پاداشتی هەیەو لەو چاکەیەدا بەشدارە.

ئەوە بە کورتی پێناسەی بانگەواز بۆ لای خواو پلەوپایەو گرنگی‌و

---

(1) (بخاری و مسلم) گێڕاویانەتەوە، (بخاری) بە ژمارە (2674) هێناویەتی.
(2) هەر چەندە (حُمُر) کۆی (أحمر)ە واتە (سوور)، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ڕەنگی سپی‌یەو حوشتری ڕەنگ سپی باشترین جۆری حوشترە.
(3) (مسلم) بە ژمارە  1893- هێناویەتی.

بایەخی بانگەواز بۆ لای خوا، وەك وەڵامی پرسیاری: بانگەواز بۆ لای خوا چییە؟!

ئێستاش با بچینە سەر تەوەرەی دووەم:

## 2) بانگەواز بۆ لای خوا (سبحانەو تعالی) چۆن دەکرێ؟!

### لە ڕووی شێوازی، ڕێبازی، ئامرازەکانی‌یەوە:

### یەک: شێوازی بانگەواز:

مامۆستا بەڕێزەکان!

وەك چەند جارێکی دیکەش باسم کردوە، تەنیا ئەوەندە بەس نیە کە ئینسان هەق بڵێ، یان شوێنی هەق بکەوێ، بەڵکو دەبێ کە هەق دەڵێ بە شێوەیەکی هەقیش بیڵێ! وە کە شوێن هەق دەکەوێ بە شێوەیەکی ڕاستو هەقیش شوێنی بکەوێ!

خوای بە بەزەیی دەربارەی قورئان دە فەرموێ: ﴿وَ بِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ﴾ (الإسراء- 105)، واتە: قورئانمان بە هەق ناردۆتە خوار، وە هەقیشی تێدایە.

دیارە (إنزال)و (نزول) لێك جیان ئەگەرنا (تکرار) درووست دە بێ، بەڵێ قورئان هەقە بە شێوەیەکی هەقیش هاتوە، هەر ئایەتەو لە

شوێنی خۆیداو هەر فەرمانێك لە شوێنی خۆیدا وە بۆ شوێنی خۆی هاتوە، هەڵبەتە قورئان یەکجار هاتۆتە خوارو (إنزال) بووە بۆ سەر سینەی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ، بەلام هەرکاتێكو لە هەر رۆژگارێكو لە هەر شوێنێکدا بویسترێ قورئان دابەزێندرێتەوەو (إنزال) بکرێتەوە، دەبێ دیسان وەك چۆن خۆی لە خۆیدا هەقە هەر دە بێ بە شێوەیەکی هەقیش دابەزێندرێتەوە.

کەواتە: دەبێ لە ڕووی شێوازەوە ئێمەش شێوازێکی هەقو ڕا ستو ڕەوان بەکار بێنن بۆ باذ گەوازکردنی خەڵك بۆ لای ڕێ بازی خوای پەروەردگار، وەك لەوبارەوە خوا (جل شأنه) دەفەرموێ: ﴿**ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ**﴾ (النحل- 125) بەڕاستی ئەم ئایەتە زۆر بە تێرو تە سەلی شێوازی باذ گەوازی ڕوون کردۆتەوە، دیارە ڕووی دواندن (خطاب) لەگەڵ پێغەمبەرە ﷺ لە دوای ئەویشەوە هەرکەسێك کە بە دوای پێغەمبەردا ﷺ هەنگاو دەنێ، کە (إن شاء الله) ئەم مامۆستا بەڕێزانەو سەرجەم مامۆستایانی ڕەسەنو زانایانی ڕەسەنو خاوەن هەڵوێستی ئیسلام، لەوانەن کە بە دوای پێغەمبەر ﷺ دەکەون، وە میراتەکەی دەپارێزنو ئەو ئەرکەی ئەو لەنێو ئوممەتیدا ئەنجامی داوە ئەوانیش بە ئەندازەی توانای خۆیان ئەنجامی دەدەن.

لەم ئایەتەدا خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ادْعُ[1] إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ﴾ بانگەواز بکە بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت، جا ئا یا چۆنیان بانگ بکات؟ ﴿بِالْحِكْمَةِ﴾[2] بە قسەو کرداری بەجێ، یان بە لێزانی‌و بە وەستایی‌و کارامەیی، (الإصابة في القول والعمل)، وە خەڵك بانگ بکە بۆ لای خوا: ﴿وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ بە ئامۆژگاری چاك، وە هەروەها ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ بەو شێوەیە کە چاکترە، واتە (بالطريقة التي هي أحسن) بە کام ڕێبازو بە کام چۆنیەتی‌یە باشترە بەو شێوەیە وتوو یژیان لە گەڵدا ب کە، وە ئە گەر نا چار بووی شەڕە قسەو موناقەشەیان لەگەڵدا بکە، ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ﴾ بێگومان پەروەردگارت زاناترە بەوەی کە لە ڕێی وی لایداوە﴿وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ وە ئەویش زاناترە بەوانەی هیدا یەت وەردە گرن، وا تە تۆ نازانی کێ هیدایەت وەردەگرێ‌و کێ وەری ناگرێ، کەواتە تۆ ئەرکی خۆت جێبەجێ بکە، نەك هەر لە ڕێوە بڵێی: فلان کەس هەر هیدایەت وەرناگرێ‌و خۆتی لەگەڵ ماندوو نەکەی!

جا لێرەدا ئەو سێ وشەیە: (الحكمة، الموعظة الحسنة، الجدال بالتي

(1) لێرەدا (أدع) (مفعول)ە کەی ( محذوف)ە، وە لە قورئا ندا مە گەر چۆن دە نا هەمیشە هەر وایە، چونکە (سیاق)ەکە ئەوە دەگەیەنێ‌و دەلالەتی لەسەر دەکات، لێرەدا واتە: (أدع الناس الى سبيل ربّك) واتە: خەڵك بانگ بکە...

(2) وشەی (الحكمة) لە قورئاندا لە زۆر (سیاق)دا هاتوەو بەکارهێنراوە، ڕەنگە زۆر واتاو ماناش هەڵبگرێ، بەڵام زۆر لە زانا یان بەو شێوەیە پێنا سەیان کردوە کە ئێمە هەڵمانبژاردوە.

هي أحسن) بە بۆچوونی مـن دەگو نجێ دوو جۆرو شێوە تەف سیرو لێکدانەوە هەڵبگرن:

**تەفسیری یەکەم: خەڵك لە بەرامبەر هەقدا بە گشتی سێ جۆرن:-**

أ- کەسانێك هەن عەودالّی دۆزینەوەی هەقن، واتە پێیان خۆشە بیدۆزنەوە بۆیە بە پەرۆشەوە بە دوایدا دەگەڕێن.

**ب-** وە کەسانێك هەن عەودالّی هەق نینو بە شتی دیکەوە سەرقالّن، بەلاّم ئەگەر بیدۆزنەوە قبوولّی دەکەن.

ج- وە کەسانێکی دیکە نەعەودالّی هەقن، وە نەئەگەر دۆزی شیانەوە شوێنی دەکەون، جا هی یەکەمیان حیک مەتی بۆ بەکاردێت ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ﴾و پێویستە بە وە ستایی‌و بە عەقلّو دانایی بانگ بکرێ، چونکە ئەو کەسەی کە عەودالّی هەقە ئەگەر بە لێزانی بیخەیە بەرچاوی قبوولّی دەکات، وە هی دووەمیان پێویست بەوە دەکات کە (ترغیب و ترهیب) بکرێ واتە عاتیفەو هەستو سۆزی بجوولێنرێ، چونکە ئەو کە سەرقالەو باوەشی لە ژیانی دنیا داوە، بۆیە دەبێ هۆشیار بکرێتەوەو لە ناخو دەروونەوە بجوولێنرێ بە ئامۆژگاری چاك (الموعظة الحسنة) چونکە زانایان لە پێنا سەی (الموعظة)دا دەلێن: قسەیەکە کەوا دلّو دەروونو هەستی ئینسان بجوولێنێ، سێیەمیان کە هەر ئامادە نیە لە ئەسلّدا هەق قبوولّ بکات

تۆش هیچ چارت نیە دەبێ وتووێژی لەگەڵدا بکەی‌و هەوڵی دەمکوتکردنی بدەی، کەواتە: وتووێژیان لەگەڵ بکە (و جادلهم) بەڵام دیارە ئەو وتووێژەش بە کام شێوە باشترە دەبێ وابێ، (بالتي هي أحسن) وەك دەبینین: بۆ وشەی (حكمة) خوای کاربەجێ هیچ وەسفی دانەناوەو بەکارنەهێناوە چونکە حیکمەت لە زاتی خۆیدا هەر چاکەو بە واتای دانایی‌و وەستایی‌و لێزانی دێ، بەڵام (موعظة) دەگونجێ باش بێ‌و دەگونجێ خراپیش بێ، بۆ وێنە: ئەگەر لەنێو خەڵکدا ئامۆژگاری کەسێك بکەی ڕەنگە دڵی پێ، نارەحەت بێ، بۆیە چاکتر وایە بە تەنیا ئامۆژگاری بکەی، وە ئەگەر بە ئامۆژگاری هەستی بریندار بکەی، مانای وایە ئامۆژگاری (موعظة)یەکی چاکت نەکرد، هەر بۆیە ئامۆژگاری مەرجدار (مقيّد) کراوە بە وەسفی (الحسنة)وە، هەروەها (جدال)یش هەر ئەوەندە بەس نیە کە باش بێ، بەڵکو دەبێ باشتر بێ‌و کام شێوە باشترە ئاوابێ، بۆچی؟! چونکە وتووێژو مشتومڕ شوێنی ئەوەیە کە کەسی بەرانبەر لەگەڵت تێك بگیرێ‌و هەڵبچێ، لەبەرئەوە پێویستە باشترین شێوازی بۆ بەکاربهێنرێ.

<u>**تەفسیری دووەم:**</u> **بۆ چوون‌و تەفسیرێکی دیکە لەبارەی ئەو سێ وشەیەوە،** ئەوەیە کە ئینسان هەم هێزی (عەقڵ)ی هەیەو هەم هێزی (دڵ)یش، بە عەقڵ لە شتەکان تێدەگات‌و حاڵی دەبێ‌و بە دڵ (قلب)یش شتەکان قبووڵ دەکات، واتە: عەقڵ هۆکارو مەرکەزی کەشف‌و ئیدراکەو، دڵیش هۆکارو مەرکەزی وەرگرتن‌و نەوەرگرتن‌و

خۆشویستن‌و بوغزاندن‌و قبوولْ‌و ڕەفزە، جا لە کاتی بانگەوازدا دە بێ بە حیکمەت عەقڵی خەڵك بدوێنی‌و هەوڵ بدەی عەقلْ‌و هۆ شیان بێدار بکەیەوە، وە بە ئامۆژگاری چاك دلْ یان‌و هە ست‌و نە ستیان ببزوێنی، وە بە وتووێژ بە چاکترین شێوەش شەڕە قسەیان لەگەڵ‌بکەی ئەگەر هەر عاسێ بوون‌و لەگەڵت کەوتنە شەڕە قسەو مشت‌ومڕەوە.

ئەوە دەربارەی شێواز، کە دەتوانرێ لێرەدا زۆر شت باس بـ کرێ، بەڵام ئێمە لە مەسەلەی حیکمەت‌و لێزانیدا، ئاماژە بە چەند شتێك دەکەین، بۆ وێنە: بەشێك لە حیکمەت ئەوەیە کە پلە بە پلە خەڵك بانگ بکرێ بۆ لای خوا (عزّو جلّ) نا بێ لە سەرەتادا هە ستین هەرچی ئەمرو نەهی هەیەو هەرچی واجب کراوەو حەڕام کراوە لە لیستێك دا ڕیزی بکەین بۆ کە سی بانگکراوو بـ ڵێین: ئا ئەوە ئیسلامە، کە بێگومان بەو شێوەیە بە بارێکی قورسی دەزانێ‌و بۆی ئەنجام نادرێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك (معاذ بن جبل) [1] خوا لـ ێی رازی بێت- ی نارد بۆ وڵاتی (یەمەن) فەرمانی پێکردوە کە بە شێوەی پلەپلەو ڕیزبەندی ئیسلامیان بۆ ڕوون بکاتەوەو تێیان بگەیەنێ، وەك لەم فەرمایشتەدا دەبینرێ:

((عن معاذ[1] بن جبل -رضي الله عنهْ- قال: بعثني ر سول الله

(1) (معاذ بن جبل) – خوا لێی ڕازی بێ– یەکێك بوو لە هاوەڵە ناودارەکانی پێغەمبەر ﷺ کە زۆر شارەزاو ئەهلی عیلم بوو، کەوا تە دە بێ بانگخوازی ئیسلامیی شارەزایی تەواوی هەبێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

ﷺ فقال: إنّك تأتي قوماً من أهل الكتاب فادعهم الى شهادة أن لا اله الا الله، وأني رسول الله، فأن هم أطاعوا لذلك فاعلمهم أن الله افترض عليهم خمس صلوات في كل يوم و ليلة فإن هم أطاعوا لذلك فأعلمهم أن الله افترض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم فترد على فقرائهم(1)...) واتە: پێغەمبەر ﷺ منی ناردو فەرمووی: تۆ دەچی بۆ لای کۆمەڵێك کە ئەوان خاوەنی کتێب (أهل الكتاب)ن، جا تۆ بانگیان بکە بۆ شایەتمان کە بێجگە لە خوا الله- پەرستراوێکی دیکە نیە، وە من ڕەوانەکراوی خوام- واتە بۆ خوا بە یەکگرتن‌و ئیمان- جا ئەگەر بۆ ئەوە وەڵامیان دایەوەو فەرمانبەریی‌یان کرد، ئنجا ئاگاداریان بکەوە کە خوا جلّ شأنە- لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، ئەگەر بۆ ئەوەش وەڵامیان دایەوەو فەرمانبەری یان کرد، ئنجا ئاگاداریان بکەوە کە خوا صەدەقەو زەکاتی لە سەر فەرز کردوون کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ‌و بەسەر نەدارەکانیان دا دابەش دەکرێ...

دەبینین لێرەدا پێغەمبەر ﷺ ڕیزبەندیی بۆ کردوون، سەرەتا بانگ دەکرێن بۆ ئیمان‌و عەقیدە، ئنجا بۆ عیبادەت، ئنجا بۆ زەکات دان...

هەروەها لە (صحيح البخاري)دا هاتوە کە دایکمان (عائشە) خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی: یەکەمین شتێك کە خوا ناردیە خوار بۆ پێغەمبەر ﷺ باسی ئیمان‌و بەهەشت‌و دۆزەخ بوو، جا کاتێك

---

(1) رواه البخاري ومسلم في صحيحيهما، (بخاری) بە ژمارە -1458- (مسلم) بە ژمارە (19).

خەلّك گەڕايەوە بۆ ئيمان، ئنجا فەرمووى: شەڕاب مەخۆنو زينا مەكەنو دزى مەكەن، بەلاّم ئەگەر هەر لە سەرەتاوە فەرمووباى: شەڕاب مەخۆنو زيناو دزى مەكەن، دە يانگوت قەت وازى لىّ ناهيّنين، واتە دەبىّ لە سەرەتاوە ئيمانو عەقيدەو ئنجا دوايى شتەكانى ديكە بخريّنە ڕوو، كەواتە: پلەپلەيى و ڕيز بەندى يەكيّكە لەو شتانەى كە حيكمەتو ليّزانى دەيانخوازىّ.

## هەروەها حيكمەت دەخوازىّ كە:

كاتيّك ئيّمە خەلّك بۆ لاى خوا بانگ دەكەين  ئەگەر بمانەوىّ لەو بانگەوازەدا سەركەوتوو بين- پيّويستە ئەوانەى قسەيان بۆ دەكەين باش بيانناسينو پيّيان ئاشنا بين، چونكە جارى وايە كەسى بانگكراو ئيمانى هەيەو پيّويست نيە باسى ئيمانى بۆ بكەى، وە جارى وايە ئەو كەسە نويّژ و ڕۆژوو طاعەتيشى هەيە، كەواتە دەبىّ چى تيّدا تەواو نيەو چى تيّدا نوقسانە باسى ئەو شتەى بۆ بكەى، چونكە وەك پيّشتر باسمان كرد بانگەواز بۆ لاى خوا سىّ بوارى هەن، هەروەها حيكمەت دەخوازىّ كە لە كاتى بانگەوازكردنماندا ئاستى خەلّك و بە پيّى ئاستى تيّگەيشتنى خەلّك قسە بكەين، لەوبارەوە خواى زاناو كاربەجىّ دەفەرمویّ: ﴿قُلْ هَـٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّـهِ عَلَى بَصِيرَةٍ﴾ (يوسف- 108) ، واتە: بلّىّ: (ئەوە ڕيّبازى منە خەلّك بانگ دەكەم لەبەر ڕۆشناييدا)، (على بصيرة) لەبەر ڕۆشنايىدا، واتە: بۆ خۆم لە دين شارەزام، ئنجا بانگيان دەكەم، وە بۆ خۆشم لەو خەلّكە شارەزامو پيّيان ئاشنام دەزانم كىّ بانگ دەكەمو دەزانم لە چ

كاتێكدا چ قسەيەكيان بۆ دەكەم، وشەى (بصيرة) لێرەدا هەمووى دەگرێتەوە، شارەزايىو ڕۆشنايىو بەصيرەت لە ديندا، لە واقيعدا، وە بەو خەڵكەى كە بانگ دەكرێن.

(علي بن أبي طالب) خوا لێى ڕازى بێ- لەوبارەيەوە قسەيەكى جوانى هەيە، دەڵێ[1]: ((حدِّثوا الناسَ بِما يَعْرِفون، أتُحِبّون أن يُكذَّبَ اللهُ وَرَسولُهُ؟!)) واتە: شتێك بۆ خەڵك باس بكەن كە بيناسن، ئايا پێتان خۆشە خواو پێغەمبەرەكەى ﷺ بە درۆزن بزانرێن؟! واتە شتێك بۆ خەڵك باس مەكەن كە لە عەقڵيانەوە نەچێ، دەبێ ئاستى عەقڵو ڕۆشنبيرى خەڵك ڕەچاو بكرێ.

(إبن مسعود)يش خوا لێى ڕازى بێ- هەر لەوبارەوە دەڵێ: ((وما أنت بِمحدِّثٍ قوماً حديثاً لا تبلغه عقولهم الا كان لبعضهم فتنة[2]))، واتە: تۆ هيچ قسەيەك بۆ كۆمەڵێك ناكەى كە عەقڵيان نەيگاتێو دەركى نەكاتو تێى نەگات، حەتمەن دەبێتە مايەى ئاشووبو فيتنەو تاقيكردنەوەو مايەى گوناهباريى بۆ هەنديكيان و پێى تووشى هەڵە دەبن.

ديسان حيكمەت وا دەخوازێ كە كاتێك قسە بۆ خەڵك دەكەىو هەست دەكەى شتێك لە دڵى ئەو كەسەدا بۆتە گرێكوێرە، نابێ تۆ هەر لەسەر قسەى خۆت بڕۆىو گوێى پێنەدەى، بەڵكو دەبێ كارێكى وابكەى ئەو گرێكوێرەيەى دڵى بكەيەوە بۆ ئەوەى ڕێگەت بۆ خۆش

---

(1) رواه البخاري.
(2) (مسلم) لە سەرەتاى (صحيح)ى خۆيدا هێناويەتى بە ژمارە (11).

بێ بۆ قسە لەگەڵداکردنی، بۆ وێنە ئەگەر کەسێك لەبارەی مەسەلەی نەتەوایەتی یەوە گرێکوێرەی لەدڵدابێ کە ئایا ئیسلام بۆ میللەت‌و نەتەوەیەکی ژێردەست‌و مەزلووم وستەم لێکراو کە قەوارەو کیانی سەربەخۆی نیەو خاك زەوت کراوە وەك نەتەوەی کورد، ئایا ئیسلام لەوبارەوە چی پێیەو دەڵێ چی؟! لێرەدا ئەگەر بێت‌و باسی ئیمان‌و عەقیدەی بۆ بکەی یان باسی عیبادەت‌و ئەخلاقی ئیسلامیی، ڕەنگە قسەکانت باش لێ‌وەرنەگرێ‌و چاك نەچنە نێو دڵی! بۆیە پێ‌ شێ دەبێ بێنی گرێکوێرەکەی بکەیەوەو ئامادەیی گوێگرتنی تێدا پەیدا بکەی، ئنجا بچیە سەر تەرتیبە ئەسڵی‌یەکەی خۆت، سەرەتا سەرنج بدە بزانە داخۆ چی پێویستە ئەوەی بۆ باس بکە، ئنجا دوایی ئەگەر ئیمان‌و عەقیدەی نەبوو لەوێوە بۆی پێداوەرە بەو ڕیزبەندیی یە مەنتیقی‌یەی کە شەرع دیاری کردوە.

کەواتە کە دەڵێین: دەبێ ڕیزبەندیی‌و پلەپەلیی ڕەچاو بکرێ، ئەوە جاروبار هەڵاواردن (إستثناء)یشی تێدایەو کەسێك کە شتێکی لە دڵدا بۆتە گرێکوێرەو هەر ئامادە نیە گوێت بۆ بگرێ تاکو لەوبارەوە شتێکی بۆ باس نەکەی‌و گرێکوێرەکەی بۆ نەکەیەوە، پێویست بەوە دەکات لە پێشدا ئەو گرێکوێرەیەی بۆ بکەیەوە، بۆ ئەوەی لەو دەروازەیەوە بچیە نێو دڵ‌و دەروونی‌و گوێت بۆ بگرێ، تاکو دوایی ئەو هەقەی کە بەو شێوەی خوا ناردوویەتی یە خوارو بەو شێوەیەی کە ئەو پێویستی پێیەتی جوان بۆی ڕوون بکەیەوە.

ئەوە لە ڕووی شێوازی بانگەوازەوە کە پێویستە حیکمەت‌و

لێزانیی تێدا ڕەچاو بکرێ، دیارە دەگونجێ زۆر شتی دیکەش باس بکرێ، بەڵام لێرەدا دەرفەتمان لەوە زیاتر نیە.

## دوو : ڕێبـازی بانگـەواز:

لە ڕووی ڕێبازی بانگەوازەوە، دەگونجێ بانگەواز بە تاکی بێ، کە ئەوە لە هەموو شێوەکانی بانگەواز باشتر ئامانج دەپێکێو لە ڕاستیدا کاریگەریشی قووڵترە، وەك ئەوەی کە دراوسێو هاوماڵتە، یان خزمو نزیکتە، دۆستو هاوەڵتە، لە دووکان یان قوتابخانەو کۆلیژەکاندا، قسەو وتووێژی لەگەڵدا دەکەی!

دەشـگونجێ بە شێوەی کۆمەڵ بێ، بۆ وێنە وتاری هەینیو وتاری بۆنەو یادەکان (مناسبات)، وە دەگونجێ بە شێوەی قسە بێ و بە شێوەی کردەوەش بێ، کە بێگومان کردەوە زۆر کاریگەرترە لە قسە، وە دەگونجێ بە شێوەی دەرسو وانە گوتنەوە بێو... هتد.

## سێ: ئامرازی بانگـەواز:

لە ڕووی ئامرازی بانگەوازەوە، پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمی خۆیدا لە پێناو بانگەوازی ئیسلامییو گەیاندنی پەیامو بەرنامەی خوادا هەموو ئەو ئامراز (وسائل)انەی کەوتوونە بەردەستی بەکاری هێناون، سوودی لە وتار بینیوە، لە شیعرو پەخشان...، ئێمەش دەبێ وا بکەینو سوود وەربگرین لە هەموو ئەو ئامرازو هۆیانەی کە ئێستا لە ئارادانو تەکنۆلۆژیای سەردەم بەرهەمی هێناون، هۆیەکانی ڕاگەیاندن بە بینراوو بیستراوو خوێندراو و بە هەموو شێوەکان.

هەڵبەتە بەکارهێنانی ئەو ئامرازو هۆیانەش نەك هەر دروست (جائز)ە، بەڵکو فەرزو واجبیش دەبێ! چونکە ئەگەر وانەکەی تۆ ناتوانی بەرپەرچی ئەو (باطل)ەی خەڵك بدەیەوە کە لە ڕێی ئەو ئامرازانەوە بڵاوی دەکاتەوە، وە ناتوانی ئەو هەقەی خۆت وەك پێویست بگەیەنیە گوێی خەڵكو جەماوەرو دڵو مێشکیانی پێ ڕۆشنو ڕووناك بکەیەوە!

ئێستاش نۆرەی تەوەرەی سێیەمی وتارەکەمانە:

## 3) بـانگەواز بۆ لای خوا بە کێ دەکـرێ؟!

دوای ئەوەی زانیمان بانگەواز بۆ لای خوا چییە، وە چۆن دەکرێ، با بزانین بە کێ دەکرێ؟!

ئەو چوار ئایەتەی لە سەرەتای کۆڕەکەمانەوە برای قورئان خوێن، خوێندنیەوە وەلامی ئەو پرسیارەمان دەدەنەوە کە بانگەواز بە کێ دەکرێ؟!

کێ دەتوانێ خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات‌و خەڵك لە خوای بەدیهێنەر نزیك بکاتەوە؟ کێ دەتوانێ خەڵك بەرەو پابەندیی بە شەریعەتی خواوە بێنێ؟!

خوا (سبحانەو تعالى) دەفەرموێ: **﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ۞ نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ۞ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ۞ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾** (فصلت 30-33)

لەم چەند ئایەتەدا خوا (سبحانەو تعالی) پێناسەی ئیما ندارانێك دەکات کە دیارە ئینسانی زۆر شایستەن بە بەڵ گەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: فریشتە دادەبەزنە سەریان، بەڵێ جا خوای باڵادە ست دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾، وا تە: بێگو مان ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان خوا (الله)یە، هەڵبەتە وشەی (ربّ) لە زمانی عەرەبیدا هەموو ئەم واتایانە دەگە یەنێ: پەر ستراو، خاوەن، پەروەردگار، سەییدو سەروەر، کەواتە (ربّنا الله) واتە: پەرستراوی ئێمە، خاوەنی ئێمە، سەییدو سەروەری ئێمە، پەروەردگارو مشورخۆری ئێ مە، خوایە، ئنجا ئەو کە سانە ئاوا دە لێن‌و ﴿ ثُمَّ ا سْتَقَامُوا﴾ پا شان بەردەوامیش دەبن، واتە: ڕاوەستاوو دامەزراو دەبن لەسەری، ئاسانە تۆ بڵێی: پەروەردگارم خوا (الله)یە، بەڵام زۆر زەحمەتە لە سەری بەردەوام بی، ئاسانەی قسەی هەق بکەی، بەڵام دوایی زەحمەتی دەوێ ئا مادەبی باجەکەشی لەسەر بدەی!!

جا کەسانێك بەو شێوەیەن ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلاَئِكَةُ﴾ فری شتەکان دادەبەزنە سەریان، زۆرێك لە تو ێژەوەرانی قور ئان دە لێن: ل ێرەدا مەبەست حاڵەتی سەرەمەرگە بە بەڵگە ڕستەی دواتر، چونکە ئینسان لەو حاڵەتەدا زۆر پێویستی بەوە هەیە کە ترسی لێ بڕەوێنرێ تەوەو دڵخۆش بکرێ‌و غەم‌و پەژارەی لێ لابردرێ، کە دواتر دەفەرموێ: ﴿أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا﴾، واتە: ترستان نەبێ لە داهاتوو و پەژارەتان نەبێ بۆ ڕابردوو، چونکە ئەوەی پەرێزی پاك بوو بەرچاویشی ڕووناك دەبێ!

هەروەها فریشتەکان پێشیان دەڵێن: ﴿وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ دڵخۆش بن بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدراوە، کەواتە: ئەوە حاڵەتێکی دیکەیەو خەریکە دونیا بەجێ دەهێڵن، ئەو بەهەشتەی کە لە حاڵەتی دونیادا بەڵێنتان پێدەدراو ئایەتەکانتان بە سەردا دەخوێندرایەوە، ئێستا دڵخۆش بن‌و موژدەتان لێبێ ئەوە بەرەو ئەو بەهەشتە دەچن! ﴿نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ ئێمە دۆستی ئێوەین‌و پشتیوانی ئێوەین لە ژیانی دونیاو دوارۆژدا، ئنجا باسی بەهەشتەکەیان بۆ دەکەن‌و زیاتر دڵخۆشیان دەکەن، ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾ هەرچی نەفستان بیخوازێ لەو بەهەشتەدا هەیەو هەرچی داوای بکەن لێیەتی، ئەوەش ﴿نُزُلاً مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ میوانداریی‌یەکە لە لایەن خوای خاوەن لێبوردەی بە بەزەیی‌یەوە.

هەڵبەتە لێرەدا ئەگەر مەبەست لە ئایەتەکە حاڵەتی سەرەمەرگیش بێ، بەڵام ڕستەی دوایی ﴿نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە بەڕاستی فریشتەکان هاودەم‌و هاوڕازن لەگەڵ ئەهلی ئیمانی خاوەن ئیستیقامەت‌و دامەزراویدا.

ئنجا بێگومان فریشتەکانی خوا چ دەورێك دەبینن بۆ ئیمانداران، بە پێچەوانەوە شەیتانەکان (شیاطین) هەمان دەور دەبینن بۆ ئەهلی کوفر، ئەوەتا خوای بەرزو توانا دەربارەی ئەهلی کوفر دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ (الأعراف-27)، واتە: ئێمە شەیتانەکانمان کردۆتە دۆستی ئەوانەی ئیمان ناهێنن، هەروەها

فەرموويەتى: ﴿شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا﴾ (الأنعام -112)، واتە: شەيتانەكانى ئادەميزادو جين هەندێكيان قسەى فريودەر دەخەنە دڵى هەندێكيانەوە، ديارە تەنيا شەيتانى جيننى قسەى فريودەر دەخاتە دڵى شەيتانى ئادەميزادەوە، كەواتە: وەك چۆن خواى پەروەردگار شەيتانەكانى مەيسەر كردوون كە لە خزمەت ئەهلى كوفر دابنو پشتتيگيرىو هاوكاريىيان بكەن لەسەر كوفرەكەيان! بە هەمان شێوە بە بارى پێچەوانەوە فريشتە پاكەكانيشى كردوون بە دۆستو پشتيوانى ئەهلى ئيمان!

هەڵبەتە شەيتانەكان وەسوەسەيان هەيە، وەك لەو ئايەتەى ديكەدا هاتوە كە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام -121) ليرەدا (وحي) بە واتاى وەسوەسە هاتوە، چونكە وەحى بە قسەى پەنهان دە گوترێ، وەسوەسەش بە دەنكى زيرو خشڵ دەگوترێ، چونكە دەنگێكى كپو لەسەرخۆى هەيە، كەواتە: خاڵى هاوبەشى نێوان وەسوەسەو وەحى ئەوەيە: هەردووكيان پەنهانن، ديارە وەسوەسە لە شەيتانەوەيەو وەحييش لە خواوەيەو لە رێى فريشتەكانەوە دەگەيەنرێ، جا ئەگەر شەيتانەكان وەسوەسەيان هەيە بۆ دۆستەكانى خۆيان لە ئەهلى كوفر، ئەوە فريشتە بەرێزەكانيش وێڕاى وەحى بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئيلهاميان هەيە واتە (خورپە) كە بە فەرمانى خوا دەيخەنە نێو دڵى ئيمانداران!

وە بەڕاستى مامۆستا بەرێزەكان! ئينسانى ئيماندار هەركەسە بە

ئەندازەی ئیمانەکەی بە ئاشکرا هەست بە خورپە (إلهام) دەکات کە لە لایەن خواوە (جل شأنە)و بە هۆی فریشتەکانەوە دەخرێتە نێو دڵییەوە، جاری وایە تۆ لە گەرمەی وتار دای یان لە گەرمەی دەرس گوتنەوە دای، یەکسەر شتێکت دێتە نێو دڵەوە، خوای پەنهانبین زانستێکت فێر دەکات‌و خورپەیەکت دێتە نێو دڵەوە، کە ڕەنگە پێشتر هەرگیز ئەوەت نەزانیبێ! هەروەك چۆن سەیر دەکەین ئەهلی کوفریش فیکرو زەینی‌و بۆچوونی پیس‌و گڵاو، یان پیلان‌و فێڵ‌و تەڵەکەی وایان لێ دەردەچێ کە زۆر سەیرو عەجایبەو دەڵێی ئەو کابرایە دەبێ چۆن ئەوەی زانیبێ؟! کە بێگوما شەیتانەکان لە پشتی ئەو فیکرو پیلان‌و فێڵانەی ئەوانەوەن، وەك چۆن فریشتەکانیش لە پشت بیروڕاو ئیجتیهادە جوانەکانی ئەهلی ئیمانەوەن، کە مایەی ڕەزامەندیی خواو سوودو بەرژەوەندیی خەڵکن!

بەڵێ جا خوای بەرزو بێ‌وێنە لە کۆتایی ئەو ئایەتانەدا کە پێناسەی ئەهلی ئیمانی پێکردن، دەفەرموێ: ﴿**وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ**﴾، کەواتە: ئەوانەی خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکەن، ئەوانەن کە دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە خوایە (جل شأنە) وە خۆڕاگریی‌و بەردەوامی (إستقامة)ی شیان هەیە لەسەری، وە فریشتەکان لەگەڵیان‌دا هاودەم‌و هاوڕازن‌و بوونە دۆستیان لە ژیانی دنیاو دواڕۆژداو لە سەرەمەرگیش‌دا موژدەی خۆشیان پێدەدەن، ئا ئەو جۆرە کەسانە دەتوانن کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکەن!

چونکە ئێمە گوتمان: بانگەواز بۆ لای خوا بە کێ دەکرێ؟! بەڕاستی

بە هەموو کەس ناکرێ، بەڵکو بانگەواز بۆ لای خوا ( عزّ و جلّ) بە دۆستانی خوا دەکرێ دیارە هەموو ئیمانداریك دۆستی خوا یە وەك لە چەندان ئایەتدا هاتوە: ﴿اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ (البقرة- 257)، ﴿وَاللّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ﴾(آل عمران- 68) ، ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ ۞ الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ (يونس 62-63)، کەواتە هەموو ئیمانداریك بە ئەندازەی ئیمان‌و تەقوایەکەی دۆ ستی خوا یە، وەك زانایان گوتوویانە: (مَن کانَ مؤمناً تقیاً، کان لله ولیاً) جا هەتا ئینسان دۆستایەتی لەگەڵ خوادا باشترو لە خوا نزیکتر بێ، ز یاتر دەتوانێ خەڵك بۆ لای ئەو دۆستەی خۆی بێنێ‌و بە ڕێبازە کەی‌و بە بەندایەتی کردنیان بۆی ئاشناتریان ب کات، وە چاکتر دەتوا نێ ئەو پەروەردگارەیان لەلا خۆشەویست بکات‌و شکۆداریی‌و گەورەیی خوا یان بخاتە دڵ‌و دەروونەوە!

بێگومان کەسێك لە خوا (سبحانەو تعالی) دوور بێ ناتوانێ خەڵك لە خوا نزیك بخاتەوە، من زۆرجار ئەم وێنەیەم هێناوە تەوە: ئا سنێکی ساردو ڕەش‌و ڕەق دەخەیە نێو کوورەیەکەوە، سەیر دەکەی دوای ماوەیەك ئەو کوورەیە ئەو ئاسنە لەگەڵ خۆیدا هاوڕەنگ دەکات‌و ڕەنگ‌و شێوەی دەگۆڕێ لە ڕەقی‌یەوە نەرمی دەکات، لە ڕەشی‌یەوە سووری دەکا تەوە! بەڕاستی ئێمەش کاتێك دەتوانین خەڵك بۆ لای خوا (جلّ وعلا) بانگ بکەین‌و لێی نزیك بخەین، کە بۆ خۆمان لێی نزیك بین! کاتێك دەتوانین خەڵك بۆ خوا فەرمانبەر بکەین کە بۆ خۆمان فەرمانبەری خوا بین!!

ئنجا ئەگەر سەرنجی ئەو ڕستە قورئانی‌یەش بدەین زۆر شتی ت ێدا

دەبینین: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللهِ﴾، بێگومان دەبێ خەڵك بانگ کردنەکەی بۆ لای خواو ڕێبازەکەی بێ، نەك بۆ لای خۆی! من هەمیشە ئامۆژگاری خەڵك‌و خوشك و برایانی خۆمانم کردووەو پێ یانم گوتوە: کاتێك خەڵك دەدوێنن‌و قسەیان بۆ دەکەن هەر بە ئایەتی قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ قسەیان بۆ بکەن! پاشان بانگیان بکەن بۆ لای خوا (سبحانەو تعالی) نەك بۆ لای حیزب ڕێکخراوو شەخس چونکە شەخس و حیزب‌و ڕێکخراو هەمووی دەبێ لە خزمەت دینی خوا دابێ، ئێمەش ئەوەمان لە خەڵك دەوێ کە ببەسترێنەوە بە دین‌و شەریعەتی خواوە، جا ئەو کاتە لە خزمەت ئەو کەس‌و حیزب‌و ڕێکخراوو کۆمەڵەش‌دا دەبن‌و کە لە خزمەت ئیسلام‌و دینی خوای پەروەردگار دان! بەڵام کە بە دینی خوا (عزّ وجل) نەبەسترانەوە، ئەو کاتە ئەگەر لەنێو حیزب‌و ڕێکخراوێکی ئیسلامییش‌دا بن هیچ سوودێکی نیەو بایی فلسێکەو نە بۆ قیامەتی خۆی سوود دەبینێ‌و نە سوودیشی بۆ تۆو حیزب‌و ڕێکخراوەکەت هەیە! هەڵبەتە بە پێچەوانەی حیزبە عەلمانی‌یەکانەوە کە دەیانەوێ خەڵك لە خزمەتی خۆیان‌و ڕێکخراوو مەرامەکانیان دابێ، بەڕاستی دەبێ ئێمە هەوڵدەین خەڵك لە خزمەتی دینی خوا دابێ، جا ئەگەر بە کەڵکی دینی خوا هات، بە کەڵکی تۆش‌و خۆیشی هاتوە!

ئنجا هەر لە ئایەتەکەدا هاتوە، ﴿وَعَمِلَ صَالِحًا﴾ وە کردەوەی چاك بکات، شتێکی ناماقوولە ئینسان قسەی باش بۆ خەڵك بکات، بەڵام

بۆ خۆی کردەوەی خراپ ئەنجام بدات، بەڵکو دەبێ پێشێ کردەوەی چاك بکات، ئنجا ئەو کردەوە چاکانەی کە بۆ خۆی ئەنجامی داون بۆ خەڵکیشیان باس بکات! هەروەها ئەم ڕستەیەش زۆر جێی سەرنجە: ﴿وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ وە بڵێ من لە مسوڵمانانم، نابێ بانگەوازکار خۆی لە مسوڵمانان جیابکاتەوە، واتە کە خەڵك بۆ لای خوا (عزّ وجلّ) بانگ دەکات، نابێ پێی وابێ لە خەڵك زۆر گەورەترو چاکترو ڕەسەنتـــرە!

وەك جاری دیکەش باسم کردوە وتاربێژ (خطیب) کە دە چێتە سەر مینبەر ئەگەر ئاگاداری خۆی نەبێ شەیتان وەسوەسە دەخاتە دڵی‌یەوەو دەڵێ: تۆ لەسەر مینبەری، کەواتە تۆ چاکتری لە هەموو ئەوانەی لە خوار مینبەرەوەن! یان کە دەچێتە میحراب، پێی دەڵێ: مادام لە پێش هەمووانی، تۆ لە هەموو ئەوانە چاکتری کە لە پشت تۆوە ڕاوەستاون!

کە بێگومان ئەوە وەسوەسەی شەیتانەو ڕەنگە مسوڵمانی وا هەبێ لە ڕیزی دواوەو لە پشتنی پشتەوە بێ لە نوێژکردن دا، بەڵام خوای پەنهانبین لەبەر ئەو لە ئیمامەکەش خۆش بێ! ڕەنگە کەسی وا هەبێ لە خوار مینبەرەوە بەڵام بە هۆی دووعای ئەوەوە، خوا ئیلهامی دڵی ئەو مامۆستایەش بکات کە لە سەر مینبەرەو وتار دەدات! وەك پێغەمبەر ﷺ دە فەرموێ: (( هَلْ تُنْصَرونَ وَتُرْزَقونَ إلاّ بِضُعَفائِكُمْ ))[1]، واتە: ئایا هەر بە هۆی بێهێزەکانتانەوە سەرناخرێن‌و

(1) رواه البخاري برقم : (2739).

ڕۆزیتان نادرێتێ؟!

بەڵێ بێگومان دەبێ ئیند سانی مە سوڵمان بە گ شتی‌و بابای بانگەوازکار بە تایبەت خۆی لەلا بچووك بێ، ئنجا لە لای خوا گەورە دەبێ و لە لای خەڵکیش ڕێزو خۆشەویستی پەیدا دەبێ!

وە من پێم وایە ئەم ڕستە بە برستە قورئانیە ﴿وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە دەبێ خۆت جیا نەکەیەوەو هیچ فەزڵ‌و ئیمتیازو شتێك بۆ خۆت بڕیار نەدەی، نەخێر بەڵکو دەبێ بڵێی من لەگەڵ مسوڵمانانم‌و لە خزمەتیان دەبم، ئەوەندە هەیە قسە لەو خەڵکە زیاتر دەزانم‌و شتێك لە دینی خوا شارەزاترم‌و ئیسلامیان بۆ باس دەکەم! ئەوە لە لایەك‌و لە لایەکی دیکەوە پێویستە بە هیچ ناوونیشانێك خۆمان جیانەکەینەوەو، ئەگەر ناچاریش بووی بۆ هەڵسوکەوت‌و مامەڵە (تعامل) لەگەڵ واقیعدا ڕێکخراوو حیزبێك پێك بێنی‌و لافیتەیەك هەڵبواسی، نابێ ئەوە بکرێتە بناغەیەك بۆ دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی (الموالاة والمعاداة)، واتە: هەر چی لەو بازنەیەدا لەگەڵت یەکی نەگرتەوەو- هەرچەندە مسوڵمان‌و ئیمانداریش بێ- بە شێوازێکی دیکە تەماشای بکەی، چونکە ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا جلّ شأنە- ناوی لێناوین مسوڵمان: ﴿هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَذَا﴾(الحج-78)، وە خوا جگە لەو ناوە هیچ ناوێکی دیکەی لێ نەناوین، بۆیە پێویستە تەنیا ئەو ناوە خۆمان ناو بنێین کە خوای کاربەجێ بۆی هەڵبژاردووین‌و هەر لەسەر ئەو ناوەش دۆستایەتی بکەین‌و، ئەو بازنەیەش کە خوا بۆی دیاری کردووین

بیکەینە نێوەڕۆکی کۆبوونەوەمانو لەسەری بژین!
ئێستاش نۆرەی تەوەرەی چوارەمو کۆتاییی یە:

## 4) ئامانجی بانگەواز بۆ لای خوا (سبحانەو تعالى) چىيە؟!

لێرەدا من سێ ئامانجم دیاری کردوون لە ئامانجەکانی بانگەوازی خەڵك بۆ لای خوا کە لە دنیادا دەستەبەر دەبنو دێنەدی، لە گەڵ مەبەستێکدا کە لە دوارۆژدا دێتەدی، هەڵبەتە ئامانجە دونیاییی یەکانیش لە خزمەت مەبەستە قیامەتی یەکە دان:

یەکەم: یەکەمین ئامانج (هدف) لە بانگکردنی خەڵکدا بۆ لای خوا (عزّ وجلّ) ئەوەیە کە: ئێمە لەسەرمان فەرزو پێویستە خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکەین، ئەو خوایەی (جلّ شأنە) کە بەندایەتیی بۆ دەکەینو هەوڵبدەین خوای بەرزو بێهاوتا بەندەی زۆربنو دۆستو فەرمانبەری زۆر بن، وە دوژمنو ناحەزی کەم ببنەوە، چونکە ئەگەر ئینسان کەسێکی خۆشویست حەز دەکات دۆستو نزیکی زۆربن! ئێمەش دەبێ خوای بەدیهێنەرمان لە هەموو کەسو هەموو شتێك خۆشتر بوێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ (البقرة-266) .

ئنجا خوای پەروەردگاریش لەسەری فەرز کردووین کە بانگەوازی بۆ لا بکەین وەك دەفەرموێ ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (آل عمران– 104)، واتە: (با لە ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن کە بانگەواز دەکەن بۆ چاکەکاریی (الخیـر)- کە ئیسلامە-، وە فەرمان بە چاکە دەکەن‌و ڕێ لە خراپە دەگرن، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن) ئەوە ئەگەر (من)ی وشەی (منكم) (مِن)ی هەندێك (تبعیض) بێ، بەڵام ئەگەر هی ڕوونکردنەوە (بیانیة) بێ واتە: ئێوە ئەی مسوڵمانینە! هەمووتان کۆمەڵێك بن کە ئەو کارانە دەکەن!

وەك پێشتریش باسمان کرد خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (العصر)دا دەفەرموێ: ﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ کەواتە: ئەو هەقەی وەرمان گرتوە کە لە ئیمان‌و کردەوەی چاکی ئێمەدا بەرجەستە بووە، دەبێ ئەو هەقە بە خەڵك ڕابگەیەنین، ئەگەر ئەو هەقە ڕانەگەیەنین، وە خۆمانی لە سەر ڕا نەگرین‌و خەڵکیشی لەسەر ڕانەسپێرین بە خۆڕاگریی، مانای وایە لەو زەرەرمەندی‌یە ڕزگارمان نابێ!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ (... بلِّغوا عنّي و لو آیة)[1]، واتە: (یەك ئایەتیش بێ لە منەوە بیگەیەنن بە خەڵك) کەواتە ئەگەر یەك ئایەت، یەك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ، یەك

(1) بڕوانە (صحیح البخاري) کە بە ژمارە (3461) هێناویەتی.

هەقیقەتی شەرعی لای هەر مسوڵمانێك هەبێ، ئەوە ئەمانە تەو مادام دەیزانێ دەبێ بیگەیەنێ بە خەڵك!

ئەوە ئامانجی یەکەمی بانگەواز بۆ لای خوا (سبحانەو تعالی) کە بەشێکە لە مسوڵمانەتیمان‌و یەکێکە لەو شتانەی کە بەندا یەتی خۆمانی پێ‌تەواو دەکەین بۆ خوای پەروەردگارو ئەرکێکی پێویستە لەسەرمان‌و پێویستە پێی هەستین‌و جێ‌بەجێی بکەین.

دووەم: ئامانجێکی دیکەی بانگەواز بۆ لای خوا ئەوەیە کە مسوڵمان دەبێ بە تەنگ خەڵکەوە بێ بە گشتی، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الدِّين النَصيحة، قُلنا لَمَن؟ قال لله وَلِكتابِه ولِرسولِه وَلأئمَةِ المسلمين وَعامّتهم))[1]، واتە: (ئیسلام دڵسۆزی‌یە، گوتمان بۆ کێ؟ فەرمووی: دڵسۆزیی بۆ خواو بۆ کتێبی خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان‌و بۆ مسوڵمانان بە گشتی)، هەڵبەتە مامۆستا بەڕێزەکان! هەمووتان دەزانن کە وشەی (نصيحة) لە کوردیدا واتە ئامۆژگاری، بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا واتە (دڵسۆزی)و بە مانای (موعظة) نایەت، لە کوردیدا دەڵێ: نەصیحەتی کرد، واتە: ئامۆژگاری کرد، بەڵام وەك گوتم: لە ئەسڵی زماندا‌و لە فەرموودەکەشدا بە واتای دڵسۆزیی دێ، چونکە ئێمە چۆن ئامۆژگاری خوا بکەین؟! یا چۆن ئامۆژگاری کتێبی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرێ؟! نەخێر بەڵکو مانا کەی بەو

(1) رواه البخاري ومسلم.

شێوەیەیە کە ئێمە کردمان.

جا دڵسۆزیی بۆ مسوڵمانان بە گشتی، ئەوەیە کە بانگیان بکەین بۆ ئەو هەقەی کە خوا ناردوویەتی، ئاگاداریشیان بکەینەوە لەو ناهەقەی کە دژی شەریعەت‌و دینی خوایە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((كُلُّكُم راعٍ وَ كُلُّكُم مسؤل عَن رَعيتهِ))[1]، واتە: هەر کامێك لە ئێوە چاودێرەو بەرپرسیاریشە بەرانبەر بە خەڵك‌و کۆمەڵگای خۆی  جا هەرکەسێك بن-.

کەواتە: بە تەنگەوەبوون‌و دڵ سۆزیی‌و پەرۆشمان بەرانبەر بە خەڵك‌و کۆمەڵگامان لەسەر فەرزو پێویستە، وەك لە فەرموودەکەی پێشتریشدا پێغەمبەر ﷺ دین  ئیسلام-ی لە دڵ سۆزییدا کورت‌و پوخت (خلاصة) کردۆتەوە، دەفەرموێ (الدِّين النَّصيحة) دین دڵسۆزیی‌یە، وەك چۆن دەربارەی حەجی ماڵی خوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الحَجُّ عَرَفَةٌ))[2] واتە: ( حەج بریتییە لە ڕاوەستان لە عەرەفات) چونکە ڕاوەستان لە عەرەفات پایەی هەرە گەورەی حەجە، ئەگەرنا حەج جگە لە ڕاوەستانی عەرەفات کۆمەڵێك پایەو ئەرك‌و واجیباتی دیکەشی هەن، بەڵام پایەی هەرە گەورەی عەرەفاتە، لەو فەرموودەیەشدا پێغەمبەر ﷺ دین ئیسلام-ی لەوەدا کورت‌و پوخت کردۆتەوە کە بریتییە لە پەرۆش‌و دڵسۆزیی بۆ خوا (سبحانەو تعالى) وە بۆ کتێبی خوا قورئان-و بۆ پێغەمبەری

---

(1) رواه مسلم.
(2) رواه البخاري.

خوا ﷺ، وە بۆ پێشەوایانو بۆ مسوڵمانان بە گشتی.

سىيەم: بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامییو بەرپاکردنی دینی خوا:

خوای بەرزو توانا لە سێ سوورەتی قورئاندا (التَّوبة، الفَتح، الصَّف)دا یەك ڕستەی فەرمووەو لە هەر سێ سوورەتەکاندا دووبارە بۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردوە بە ڕێنماییيەوە وە بە دینو بەرنامەیەکی هەقەوە.

کەواتە: ئیسلام پێش ئەوەی دینو بەرنامەیەکی هەقو سیستەمێکی هەقی حوکمڕانی بێ بۆ بەرپاکرانو پیادەکران لە ژیانی خەڵكو کۆمەڵگادا، هیدایەتو ڕێڕوونییەو دەبێ تاکەکان وەریبگرن بە هۆی بانگەوازو خەڵك بانگ کردنەوە، هەروەك دوایی کۆمەڵێك میکانیزمی دیکەش هەن بۆ ئەوەی شەریعەتی خوا بچەسپێنرێو پیادە بکرێ.

ئێستاش با بۆ زیاتر بەرچاوو ڕوونبونەوەمان لە بارەی ئامانجی یان ئامانجەکانی بانگەوازی ئیسلامییەوە ئەم فەرمایشتە بێنینەوە:

((عَن أم سلمة -رضي الله عنها- في حديث الحبشة من كلام جعفر في مخاطبة النجاشي فقال لهم.. فقال له أيها الملك! كُنّا قَوْماً أهل جاهليةٍ

نعبدُ الأصنام وَنأكل الميتة وَنأتي الفواحش وَنقطع الأرحام وَنُسيئُ الجِوار وَيأكل القويُّ منّا الضّعيف، فَكُنّا على ذلك حتى بعث الله الينا رسولاً منّا نَعرفُ نَسَبَهُ وَصدقَهُ وَأمانَتَهُ وَعفافَهُ، فدعانا الى الله لِنوَحِّدَهُ وَنَعْبُدَهُ وَنَخْلَعَ ما كُنّا نَعْبُدُ نَحنُ وَآباؤنا من دونه من الحجارة والأوثان.

وأمَرَنا بصِدقِ الحَديثِ وَأداءِ الأمانَةِ وَصِلَةِ الرَّحِمِ وَحُسْنِ الجِوار وَالكفّ عن المحارم والدِّماءِ وَنهانا عن الفواحِشِ وقَولَ الزُّورِ وَأكْلِ مالِ اليتيم وَقَذفِ المُحْصَنَةِ، وأمَرَنا أنْ نعبُدَ الله وَحْدَهُ ولا نُشْرِك بِهِ شيئاً وأمَرَنا بالصَّلاةِ والزَّكاةِ والصِّيام. قال: فَعدَّد عليه أمُورَ الإسلام، فَصَدَّقْناهُ وآمنّا به واتَّبَعناهُ على ما جاءَ بِهِ) ( أخرجه الإمام أحمد، وقال أحمد شاكر: إسنادُهُ صحيح، وقال الهَيثميُ إسْنادُ رجالِهِ صَحيحٌ.

لەو فەرموودەیەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خەڵك بانگکردن بۆ لای خوا (عزّ وجلّ) چەندان ڕەهەندی فراوای هەن، وە بۆمان دەردەکەوێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن خەڵکی بۆ لای خوا بانگ کردوەو خەڵکی لە چی‌یەوە بۆ چی بانگ کردووە، ئێستاش با بڕگە بڕگە بە کورتی فەرموودەکە مانا بکەین:

((عَن أم سلمة -رضي الله عنها- في حديث الحبشة من كلام جعفر في مخاطبة النجاشي فقال لهم.. فقال له أيها الملك! كُنّا قَوْماً أهل جاهلِيةٍ نعبدُ الأصنام وَنأكل الميتة وَنأتي الفواحش وَنقطع الأرحام وَنُسيئُ الجِوار ويأكل القويُّ منّا الضّعيف)) واتە: (أمّ سلمة) هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ - خوا لێی ڕازی بێ، وتووێژی نێوان جەعفەری کوڕی ئەبوو طالب  خوا لێی ڕازی بێ‌و پادشای حەبەشە (نجّاشي)مان

بۆ دەگێڕێتەوە، جەعفەر پێی دەڵێ: ئەی پادشا ئێمە کۆمەڵێك بووین کۆمەڵگایەك بووین کە: بتەکانمان دەپەرستن، گۆشتی مردارەوەبوومان دەخوارد، شتی ناقۆلامان[1] دەکرد، پەیوەندی خزمایەتیمان دەپچڕاند، لە دراوسێیەتیدا لەگەڵ یەکدی خراپ بووین، ئەوەمان کە بەهێزبوو ئەوەی دەخوارد کە بێهێز بوو، -واتە یاسای دارستانو یاسای دەریا حاکم بوو-، ئاوا باسی سەردەمی نەفامێتی دەکرد، ئنجا دەڵێ: (فَكُنّا على ذلك حتى بعث الله الينا رسولاً منّا نَعرفُ نَسبَهُ وَصدقَهُ وَأمانَتَهُ وَعَفافَهُ فدعانا الى الله لنوَحِّدَهُ وَنَعْبُدَهُ وَنَخْلَعَ ما كُنّا نَعْبُدُ نحنُ وَآباؤنا من دونه من الحجارة والأوثان)، واتە: ئێمە لەسەر ئەو شێوەیە بووین تا خوا پێغەمبەرێکی ﷺ لە خۆمان بۆمان نارد، ڕەچەڵەکی دەناسین، ڕاستگۆیی ئەومان دەزانی، ئاگاداری ئەمانەتو پاکیی ئەو بووین، نەفس بەرزیی‌و پاکیی (عفاف)ی ئەو پێغەمبەرەمان لەبەرچاو بوو، جا

---

(1) چونکە وشەی (فاحشة) هەر بە مانای (زینا) نایەت، بەڵکو بە (بُخل)یش دەگوترێ، واتە چرووکی‌و ڕژدیی، وەك خوا (عزّ وجلّ) فەرموویەتی ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً﴾ (البقرة -268)، کە دیارە مەبەست لە (الْفَحْشَاء) لێرەدا ڕژدیی‌و چرووکییە وەك لە سیاقی ئایەتەکان دەردەکەوێ. وە بە قسەی خراپیش دەگوترێ وەك خوا (تبارك وتعالى) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ (النور -19) چونکە مەبەست لە وشەی (فاحشة) لێرەدا بوختانی داوێن پیسی بە خەڵك کردنە، وەك لە سیاقی ئایەتەکاندا دیارە.
وە بە سەرپێچی ئافرەت لە مێردیش دەگوترێ، وەك دەفەرموێ: ﴿يَا نِسَاء النَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ﴾ (الأحزاب-30)، وە جاری وایە بە مانای زیناش دێ، کەواتە (فاحشة) واتە شتی ناقۆلاو کرداری دزێوو ناشیرین. (هەر دەقی وتارەکەیە)

بانگی کردین بۆ لای خوا بۆ ئەوەی بە تاك‌و تەنیای بگرین‌و بیپەرستین‌و، ئەوەی باب‌و باپیرانمان لە بت‌و صەنەم دەیانپەرست وازی لـێ بـهێنین، ئنجا جەعفەر  خوا لێی ڕازی بێ- گوتی: (وأمرَنا بصدقِ الحَديثِ وَأداءِ الأمانَةِ وَصِلَةِ الرَّحِمِ وَحُسْنِ الجِوار وَالكفّ عن المحارم والدِّماءِ وَنهانا عن الفواحِشِ وقَولَ الزُّورِ وَأكْلِ مال اليتيمِ وَقَذفِ المُحْصَنَةِ)، واتە: وە ئەو پێغەمبەرە ﷺ فەرمانی پێ کردین بە ڕاستگۆیی، وە بە ئەمانەت پارێزی‌و ئەمانەت گەیاندنە شوێنی خۆی، وە گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتی، وە هاومالێتی چاك لەگەڵ یەكدیدا کردن، وە دەست گێڕانەوە لەو شتانەی حەرام کراون لە خوێن‌و ماڵی یەکدی، وە ڕێگریی لـێ‌کردین لە هەرچی گوناهی ناقۆڵاو ناشیرینە، وە لە قسەی درۆ، وە لە خواردنی ماڵی هەتیو، وە لە بوختان کردن بە ئافرەتی پاك، ئنجا دەڵێ: (وأمَرَنا أنْ نعبُدَ الله وَحْدَهُ ولا نُشْرِك بِهِ شيئاً وأمَرَنا بالصَّلاةِ والزَّكاةِ والصِّيام. قال: فَعدَّد عليه أمُورَ الإسلام، فَصَدَّقْناهُ وآمنّا به واتَّبَعناهُ على ما جاء بهِ)، وە فەرمانی پێکردین کە تەنیا خوا بپەرستین‌و هاوبەشی بۆ دانەنێین، وە فەرمانی پێ کردین بە نوێژ(1)و زەکات‌و ڕۆژوو، ئاوا کاروباری ئیسلامیی هەموو بۆ ژمارد، ئێمەش بەڕاستمان زانی‌و ئیمانمان پێ‌هێناو شوێنی کەوتین.

---

(1) دیارە مەبەست ئەو نوێژو زەکات‌و ڕۆژووە دیاری کراوە نیە کە دوایی فەڕز کراون، چونکە ئەو کاتەی جەعفەر ئەوانەی ڕوونکردۆتەوە بە شێوەیەکی دیکە بووە، کە زانایان دەڵێن: بۆ وێنە دوو ڕکات نوێژی بەیانیان‌و ئێواران هەبووە، لە مانگێکدا (3) ڕۆژوو هەبووە، زەکاتیش واتە: جۆرێك لە ماڵ بەخشین، (هەر دەقی وتارەکەیە)

کەواتە مامۆستا بەڕێزەکان بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو گشتگیریی‌و بەرفراوانیە بووە!

## مەبەست (غایە)ی بانگەواز بۆ لای خوا (سبحانەو تعالى):

لە ڕاستیدا هەرچی ئینسانی مسولمان لە دونیادا دەیکات‌و هەرچەندە دەجووڵێ‌و دێت‌و دەچێ، هەمووی بۆ یەك مەبەستە ئەویش ئەوەیە کە خوا لێی ڕازی بێ‌و پاداشتی بداتەوە، وەك خوا (جلّ شأنە) لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئاماژەی پێدەکات، بۆ وێنە دەربارەی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللهِ وَرِضْوَانًا﴾ (الفتح- 29) واتە: پاداشت‌و ڕەزامەندیی خوا (عزّ و جلّ) دەخوازن ئاشکراشە کە مەبەست لە چاکە (فضل)ی خوا (تبارك و تعالى) بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەیەو ڕەزامەندیی‌یەکەشی لە بەهەشتیش گەورەترە، بەڵکو بەهەشتیش بۆیە خۆشە چونکە ڕەزامەندیی خوای تێدایە! وەك دەفەرموێ: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (التوبة -72)، واتە: وە ڕەزامەندیی لە خواوە گەورەترە (لە هەموو شتێك) ئا ئەوە بردنەوەی گەورەیە.

بەڵێ هەرچی کە ئینسانی ئیماندار دەیکات بۆ ئەوەیەتی کە خوا لێی ڕازی بێ‌و بۆ ئەوەیە کە خوا (جلّ شأنە) پێی بڵێ: سەلماندت کە بەندەی منی، بۆیە هەر ئەوەش مەبەست (غایة)ی بانگەوازە بۆ لای خوا (عزّ وجلّ) وە پاڵنەرو هاندەریەتی‌و هەموو ئامانجەکانی دیکە لە

خزمەتی ئەو مەبەستە بەرزە دان.

جا بەڕێـــزان!

بانگەوازکارە خۆشـەویستەکان!

ئەوە کورتەیەك بوو دەربارەی بابەتی گەورەو گرنگی: (بانگەواز بۆ لای خوا)و هیوادارم بووبێتە مایەی زیاتر بەر چاو ڕوون بوونەوەتان لەوبارەوە.

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه أجمعين

والحمدلله رب العالمين

# نێـوەرۆك

# لەم نامیلکەیەدا

هەوڵدراوە کە بە کورتی‌و پوختی‌و لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەت‌و فەرموودەیەك دا پێناسەی بانگەواز بۆ لای خوا ( عزّ و جلّ) بکرێ‌و تیشك بخرێتە سەر گرنگی‌و پلەو پایەی.

وە چۆنیەتی بانگەوازکردن بۆ لای خوا بخرێتە ڕووو کە سایەتی بانگەوازکارانی ڕێی خوا بناسێنرێ، وە ئامانج‌و مەبەستی بانگەواز بۆ لای خوا (تبارك و تعالى) ڕوون بکرێتەوە .

## لەم نامیلکەیەدا

هەوڵ دراوە کە بەکورتی و پوختی و لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەت و فەرمودەیەک دا پێناسەی بانگەواز بۆلای خوا (عز وجل) بکرێ و



تیشک بخرێتە سەر گرنگی و پلەو پایەی.

وە چۆنیەتی بانگەواز کردن بۆلای خوا بخرێتە ڕوو و کەسایەتی بانگەوازکارانی ڕێی خوا بناسێنرێ، وە ئامانج و مەبەستی بانگەواز بۆلای خوا (تبارك وتعالى) ڕوون بکرێتەوە.

عەلی باپیر






نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن.

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2230908 - 2221695- 2518138
موبایل: 07701387291 – 07504605122
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
altafseer@hotmail.com

